خَریک شیوەنە لەگر شوانا — ٤٩٨
لەولاو، دیو، ئەخوا لەگر گرگانا

حڕامە لەگر ناجنسا کلام
سَلامی لەگر خەڵکا وَسلام

هیچ کاتێ مەچوە هوێجی مَێنەتەو
خەفَتی سوزی مەکە مِل خوتەو ٥٠٠

جوان وریا بە ئەوانە پیرن
دونیایان دیوە زور ئێرادگیرن

ئەی بالادس تو خوتیش ژێردەسی
ئەر ئازار بەخلک بگەینی پەسی ٥٠٢

کاش گشت حرامی مەسی باور دا
بادانەی، وریا نەما لە دونیا

ئیمە هرتا بیخ گەلۆمان ئاوە
موفتە وێژ هالە، وشکی وێساوە ٥٠٤

ئیضافە لە حَد تۆ خوت ئەکوژی
ئەو مەیتە بە ئەم شیوەنە ناژیی

بُوخوەو ببەخشە کەمێکیش دا نــە ٥٠٦
هَرچیٚ جیٚ بێلیٚ بوٚ دیگرا نـــــە

چل گز با ز ئەوەی دەی فرمو بیکە
ئەگر یز دٛ دورە خو گەز نزیکـــە

تە ماگر مەوە بە هیوٚای خاور ـــ
خاور بوٚتو، هَر ناویە ئاو، هاور ٥٠٨

لەوکاتا تَنگبت سوارت ئەو یٚ
دَست خالی بیٚ و ئیٚطـوارت نَوێ

تاوان خومانە واکە بدٛ بَختین
ئەرنجینە شوین بدٛەوخوشبختین ٥١٠

کی لە پیشانیت بدٛی نو سیـــوە
هَر چیٚت هَس خوت بوٚ خوتت کرٚیوە

صد جار وتم پیت باز هر نازنەویت
ئیتر نایتەوە،کاتیٚ ڕویت ڕویـــت ٥١٢

سَر بچوک و ریش باریک و طَویل
هر سیٚ بوٚاحمـق نیشانەو دلیــل

کسێ کە زانی و زانی ئەزانێ
ئەسپی شەرف لە عالَم ئەڕانێ ٥١٤

ئەگەر نەزانێ و، زانی نازانێ
کەرە، شەلەی خوی تا ماڵ ئەڕانێ

کسێ نەزانێ هیچی نازانێ ـــ
تا مەحشر هەر لە جەهلا ئەمانێ ٥١٦

ئەوان دوکەس بۆن ڕفێق و هەمرا
ئێمە صەد نفر بە تەک و تەنیا

ئادم ترکیبێ فرە جوانە
نیمی فریشتە نیمی حێوانە ٥١٨

ئەر بەم‌لا بۆڕوی بانترلە ئەمە
ئەر بەولا بۆڕوی لە ئەویش کەمە

خوت سوک و شەکت پەشیمان مەکە
ئێمتحان کریاو ئیمتحان مەکە ٥٢٠

دایم پێ کەنین بێ لە دەمتەوە
با دونیا، کەنێ هر لە دەمتەوە

له دونیا کسێ تەواو هەژارە
حسودو بەخیڵ هەم طمع کارە ٥٢٢

خواوند خوشی تێ لە جوانێ
کە توبە بکاذ هَر بە جوانی

ئەگر تەماتە کارت کەفیە بەر
زولە خەو هەلسە لە کاتی سَحَر ٥٢٤

بە زۆر شکێنی خڵک کاڵەو مەکە
بە مێنت ئیحسان بَطاڵەو مەکە

هر ضربێ بو خوی ئێشی عَیانە
ئێش لە دسی دوس فرە گرانە ٥٢٦

لە ضعیف ڕوا نیە بکەی زور
ظاڵم ناوخشی خلاقی غَفور

ها توچوی خَڵکی خوی کارێکە خاس
وَلی نە ئەونە مردم بکەی یاس ٥٢٨

روژوبگرێ ونمازی تەوی
وەکو وەویکە جیهازی نەوی

بۆ دینی ئیسلام هر ئەوە بەسە
مەسی حَرام کرد لەهَرچی کەسە ٥٣٠

باشیان فرمووە ئەو طَریقەتە
حقێقەت دینەو، دین حَقێقەتە

دیاری ئەدیب ئەو نوسینەیە
جێتێلی هَرچی، لە نێو سینەیە ٥٣٢

گەورەئی گشتی بە وتار نیە
دوصد وتە وەک یک کردار نیە

پَندونصیحت بە لوقمان ئەکەی
خریکی زیرە بۆ کرمان ئەبەی ٥٣٤

لذتێ واها لە عَفو کردن
هیچکاتێ نیە لە تولەسَندن

کاتێ دیت خەفت هاتە بەرەوە
ماڵ بێلاّ وەجێ بێرە دەرەوە ٥٣٦

هرکەسێ بۆخوی لەبیری ماڵە
خوش بەحاڵ کەسێ ماڵی حەلاڵە

ئیمه بوچل سالْ هاتوینەسەیاس —
خوا بێته فریاد خَضرو کا اِلیاس ٥٣٨

خاون چوار شت عبدیکی عالــــه
عێفت و عیلم و حیلم وعدالــه

سێ شت هەس ئینسان تیّری لێ ناخوا
لەش ساغی و ژین ئەموالێ دونیــا ٥٤٠

دوشت زور تالن لم دار دونیــا
ناخوشی غریب ، پیرُتەک وتنیــا

چوار شت کەمیشی زورو خراوه
ئێش و هژاری عارو عَدار ە ٥٤٢

مندالێ خراو شەشم ئەنگوشتــــه
بی برّی ئەێشی بمێنێ زشـــــته

والی بوّ ولّات وەک سەرە بوّ تەن
حاکم باش نەبێ وێرانه وه طــن ٥٤٤

ئەگر تەماته قدرت نەبێ کَــــم
بە راس یا دورو هیچ مەخوەقَسَم

قسەی راس بێژەو دوربەلە کەلەک
خەڵک لە قسەم خور ئەکەفێتەشەک ٥٤٦

دنگی موتورە گریان و کەنین
نیشان ئەدا حالْ دلشادو خمین

تاویٚ خوت بنیٚ وجێگەی خەڵکی —
ئەو سا قضاوت بکەی بە کەڵکی ٥٤٨

ئەبەسزیٚ درگا، کاتیٚ کە مردی
هرکە بوٚ دین و خوا کردی بردی

ئەگر ئەتوانی دڕکیٚ هەڵکەنە
لە جێگەی ئەوا گولیٚ دابنە ٥٥٠

هرکەسیٚ کە بڎ قەولەو دمدەمی
باوڕت نەبیٚ هیچ بەقەسەمی

لەم دونیا جوریٚ تو رفتار بکە
روت ببی بیژی تویش وەک من کە ٥٥٢

وایە فرمووە وَیس یەمەنی
بینی جسور بەو، گاهی تأنی

هرچی ئەتوانی ڕوبەرو بێژی ٥٥٤
ئەبێ پشتە سەر هرئەوە بێژی

ئەونە بێ مغزە، هروەسە شتێ
بۆ کوێر هەلێپەڕێ بۆ کڕبیکوتێ

کەسێ کەلەگر تو خراو نیە
خراپە، لە حق ئەو صواب نیە ٥٥٦

کسی کەبە شیر داغ دمی سوتا
ئەر دویش بخوا، پفی لێ ئەکا

تو کە فێر بوون وەعار ئەزانی
بێ خبری لە عاری نەزانی ٥٥٨

هرچی ئەزانی پندو موچیاری
تو بێژە هرچند کم خریداری

ئەگر، دو کێف بن، چە پیاووچە ژن
لافاوی خفت تێرێدیان لە بن ٥٦٠

ئەر ژینت نەبی تو لە بەهشتا
ئەبژی هشتا مغمونی هیشتا

له دسیا نەوە بقا ل زەلیلـــە ٥٦٢
ئەگر صولّح بکەن مشک و پشیلە

ئیسلام نەژنەوی کافر نەوێسنی
بێژە با کرپەی گیانم نەمێنی

کەر، وەزیندوی بَرنەقیز، نەگرێ
بتـــوپێ چون بَرچا و چلّە ئەگرێ ٥٦٤

لە ئاسیا و ریشت سپی کرد وە
والە مَعریفَت بود نەبزد وە

مەێ خوەو، بسوزنە، مینبرو خەرقە
وەلێ تو مردم ئازاری مەکـــە ٥٦٦

تاقت بێرانە، خوت مەکە وپـە ن
هیچکـە تا ئەبد نا مێنی لەبەن

ئەر ئەم تیرانە، روسم ئەینێرن
نە بو مردو، بۆ زیندو بکیێـــرن ٥٦٨

بویە خوا، دوَلەت، دای نا وەکەنم
نیمی خوت بیخوە نیّمی بە مَردم

هرکەخوی لە خەڵک ژیرتر بزانێ
ئەوە ئەحمەقە بە خوی نازانێ ٥٧٠

هرکەسێ هەسی رەویەی سَخاوت
پیویستی نیە زورو شَجاعت

قسە ئەر طلاو دوڕو گەوهَرە
باز ناشیرینە دُوینی فرە ٥٧٢

لەگر بذکاران مەوە بە هاوسێ
ئاخر تویش هروەک ئەوانت پێتێ

ئەمە فرمودەی عیسای مەسیحە
لەگر دوژمنا دوسی صَحیحە ٥٧٤

ئەر تاقت بیری ئاخر پیروزی
لە هالە هەلوا ئەخوریی سوزی

ئەگر تەماتە دوربی لە شیطان
مُعلم نفس بەو شاگردی ویجدان ٥٧٦

حدیثی صَحیح واتەی حەضرەتە
مالێ بێ مندالێ کەم بەرەکەتە

هرکس خوی بکا بەسزباری خەڵک ٥٧٨
مَلعونە بوژین هیچ نایێ بەکڵک

هرکس بدْ مَزاج هم بدْ ئیْخلاقــــە
ویجدانی نَفسی ئەکا فەلاقــــــە

هَرکە ئیْشانی دلْ دایک وبابی ٥٨٠
ئەبێ بترسێ زور لە حیسا بــــی

ئەر شیرّو نَهنگ پولَنک وفیلــــی
بەدس مەرگەوە ئاخر ذەلیلــــــی

فتنەو دوزوانی کاری‌نە فامە
فاسق و فاجــر بێ ئیحترامــە ٥٨٢

پیر ئاخر خَیر بێ لەنیّو میلَتی
وک پَیغەمبەرە لە نیّو ئومــەتی

ئەولْ جار بورّو هاوسێ بویّنە
ئەوسا جابورّو خانو بسێنــــە ٥٨٤

تو زور بترسە لە چاپلوســــی
حرامە بکەی لەگەریان دوســـی

راسی و دورستی بۆرضای خواس —
هرگیز گوم ناوی کسلەرێگەیراس ٥٨٦

دۆشتلە زسول ماوە بۆ ئو مەت
قورئانی خوداو سونتی حەضرەت

بڎ بختی تەنیا ئەوەیە خاسی
دوس و دوژمنت تەمیس ئەناسی ٥٨٨

چند جَور چند جَفا چند خاکەساری
بۆم بە شوانەکەی حەق نادیاری

قول ڒەش و چرمو ناکفیە دیار
تاکاتی ئینسان نەگیتە بکار ٥٩٠

خراو ترین دوس ئەوەس، بکوشی
تا ڕیفت بکاو عَیبت بپوشی

گشت بە ئومیدو هوای هیوایە
بویە بە مندالّ شیر ئەڎا دایە ٥٩٢

ئەر کَج دابینێ بەنا، ئەولّ خشت
ئاقیبَت ئەڒمی دیوارەکەی گشت

به منداڵی پەس٬به جوانی مەسی
به پیریش سِسی کەی خوا پَرسی؟ ٥٩٤

راسه زانای خاس لەزانای دەغلْ
جیاوه نابن غَیَر به حُسنی عَملْ

ئەوەیه بهرەیْ زانین لە دونیا
تو بپارێزی لە گوناو خه طا ٥٩٦

سێ کس لەم دونیا زومەبن فانی
قَصاب و دار برْ نەچیرەوانی

هَرچی فره بیْ هرزانتر ئەبێ
عیلم فره وبێ گرانتر ئەبێ ٥٩٨

هیچ خوراک مەخوه بەبێ اِشتها
بەر لە تیْری دەس کێشه لە غذا

پیاوی دَیوس و بێ عورزەو غیرت
هرگز نازنەوی بُوی لە چه نه ت ٦٠٠

ئیمانی کاملْ نیه هیچ کەسی
ئەر راضی نەبێ هاوسێ لەدسی

هرکەسێ عەهدو پەیمانی نیە
بیناسە ئەوە ئیمانی نیە ٦٠٢

هرکسێ نەکا شوکرانەی خودا
بەدلْ لە هیچکەس تەشکر ناکا

ئەگر خوشت تێ لە پیاو خاصی
بیکە بە پێشە دورستی وراسی ٦٠٤

مردنی خلْکی و قوم و ئەقرەبا
موعێظەس کەسێ هوشی پێ بڎا

وایان فرمووە زاناو ژیرەکان
شەڕلە شێف باشە ئاشتی لە خەرمان ٦٠٦

کسێکت دی بێ شەرم و حەیایە
ئەر غیبەتیان کرد مەیژەگنایە

هەرکس مارەئی ژن نەفلْە بکا
لەگر خێزانی خوی زنا ئەکا ٦٠٨

کەسێ بەراسی تەمای مردنە
هەمیشە کاری چاکە کردنە

مەحاڵە ڕەحمی خوا نازڵ نەوی
لەو ماڵە هەتیم تیا گەورە ئەوی ٦١٠

قسەی کەم باشە هرچند مەلا یە
قسە نوقرە، بێ سکوت طەلا یە

عیادت بیمار ڕەویەی رسولە
هیچ تەرکی مەکە فرە مەقبوڵە ٦١٢

ئەر بمرێ لە ڕێ زانینا هرکەس
ئەجر شەهیدی ئەکەفی تە دەس

چە باش فرمویە شاهی مەدینە
(اُطلُبُوا العِلمَ وَلَوبِا لصّینَ ٦١٤

ئەر صیلەی ڕەحم وەجێگە بێری
توشەی قیامت بوخوت ئەنێری

کوڕ خاص هرلە منداڵی دیارە
مشت خوی نمونەی بارو خەروارە ٦١٦

کم وبیش ئەبن بە عادت کردن
خەوو، خواردن و، زورقسە کردن

مەخوە شتی زور گرمە یا سردە ٦١٨
با دوچار نەبی بە دردی معدە

لەجێگەی نمناک پا دا مەکیشـــە
توشت تی روماتیس و دلٚ ئیٚشە

ئاو شەووخەوزوژلەش بیمار ئەکا ٦٢٠
ژن کوڕدار مالیٚ شو خراو ئەکا

آگر عاقل و خاون ئیمانـــی
هرگز مەخەفە توبە عوریانـــی

دستت بشورە دایم بە صاون ـــ ٦٢٢
رو پاکەو مەکە بە چاکی داون

هرپوشیٚ مەکە وَبیخ دیانـــا ـ
سیواک کە لە وختخەوو بەیانا

دەس بە چناکەو دودس بە ئوژنو
مەیکە بە عادت ناجورە بۆتــۆ ٦٢٤

ئەگر ئەنگوست نەکیتە بینـــی
تولە سینوزیت محفوظ ئەمێنـــی

سمێڵ کوتا کەو پێ مەکە بازی
ئیسلام وبهداشت لێت نابن راضی ٦٢٦

ئەگر لاوازی وبە کوڵنج فێری
مەچو بۆ حەمام لەوخت تێری

لە پاش حَمام چون خفتن صَوابە
مایەی تَسکینی روح و ئەعصابە ٦٢٨

باشی فرمووە رسولی موختار
لەش دامەپوشە لەبادی بَهار

کوتا کە زوان لە غَیبەتی ناس
تالە عقوبت مَحشر بی خەلاص ٦٣٠

زور قسە مەکە صُبح تا ئێوارە
قسە هزارە دویان بەکارە

%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%%



## ٨١
## بەشی بەخیلّی ،فتنەئی َوخیانت

ئەترسی هرکەس خەیانتکار ە
ئەر چێو هەلّ بکری سگ دز دیارە

لە چلەی زمسان بەلە ئاوی سزد
بەو شرطە نەی لەپرد نامرد ٦٣٢

هر دەردی بوخوی درمانی هەیە
گَوجی وَبخێلی َعلاجی نیە

ئەگەر واز بێریّ حسودی بێ فَرّ
ئاو ئەخواتەوە گرگ لەگەڕیّ مرّ ٦٣٤

کەر دێزو ئەکا حەز بە توپینی
بەلکو خاونی ضرەربوێنیّ

بێلا دا کەفیّ خَسیس بذکار
یازەبی خودا پانذاتە مار ٦٣٦

ئەبلەئەوەیە کە خوی ناناسیّ
هر روژی دەرتی لەنیو کراسیّ

قدیم ویژیاوه مالی ئه‌مانت
خاک وگلیش لیٔ ناکه‌ن خیانت ٦٣٨

دز به شه‌و دزه ئه‌م به نیوه‌ڕو
ڕحمت له‌روحی‌کفن‌دز به‌رو

دزی خرابه چه وردو چه زل — ٦٤٠
میروی مالٚ هاوسێ شه‌وئه‌یکه‌نه‌مل

تا دزو خائن هاله ولاتـــــــا
خه‌م وئاخ کیشان هرهاله پاتــا

سه‌رتا پای بالاّم حسره‌ت و خه‌مه
حسود هر ئه‌یژی خه‌فه‌تی که‌مــه ٦٤٢

هرکه‌سێ نه‌بێ له‌بیری تولـــــه
ئه‌و له‌بابی خوی نه‌بووه،زولــه

چاییک تالٚت خوارد ئه‌ر له‌گزکه‌سێ
خیانتی پێ بکه‌ی ناکه‌ســــــی ٦٤٤

ئه‌شیا بمردای ئه‌بی داڕز ی
ڕفیق قافله‌و،شریکـــــی د ز ی

تا کۆڵە فیتنە ئاوێ ژێر کاوێ ٦٤٦
شەڕو ناکوکی دوائێ نائێ

سگ ئەر نوستوە ڕای مەپەڕێنە
فتنە خەفتوبێ هەڵی مەسێنە

قسەی دوکراسان بێ اِعتبارە ٦٤٨
وەکونیسک بەرو پشت نادیارە

ئاشم لە ڕوژا ئەونە دەر دێنێ
ئاشەوانە کە خوی بی قەپێنێ

هرکەس حَسودە یا طَمع کارە ٦٥٠
گنج قارونی بێ هشتا هەژارە

حسود لە دونیا لذت ناوێنێ
جورم و خطای بۆ مَحشر ئەمێنێ
کەلە شێر برسی کزو ناتەوا و
خرمان ئاو بریاو ئەوێنی لە خاو
دَولەمەن کومەک بەهژار نەکا
رسوا و سەر شوڕە لە هردو دُنیا



(ئیـقتصادو تێکوشان

۸۴

نداربۆ نانێ لە دەواندەوە
دارا هالە شون دَوای مێعـدەوە ۶۵۲

والە چوار شتا لذتی دونیـــا
خێزان و خانو دَولەت و طـەڵا

چوار شت لە دونیا نابارو تاڵە
یکی لەوانە زوری عەیاڵـــــە ۶۵۴

دوهم ژن خائن سێ هاوسایخراو
چوارم داماوی وژینی ناتەواو

دونیا هەروەکو لاشەی مورداره
طالبی زورتر سگ و کەمتاره ۶۵۶

وابە بۆ دونیا کە جاری نامری
بۆ عوقبایش وابە کەسوزی آمری

قَناعت بکە دایم لِە دونیـــا
(اَلْقَناعَةُ کَنزٌ لا یفنـــیٰ ) ۶۵۸

هرتا جوانی زحمەت بکێشــــە
لە کاتێ پیـــری راحت بنیشە

هیچکەس بە تاجەو ناتوەسە دونیا
بومالْ و مەقام سەر مڎە وەبـــا ٦٦٠

تێکوشە هیچوخت نڎەی ناخونەک
ئەر سەودات نیە لەدوکانی خَڵک

لە دونیا هرکەس کرا نشینە
بێ خَم وخَیالْ هم خوش نشینە ٦٦٢

ئەڎ بَخشم هرچند فرە نیم راضی
ئەیکەم بەخاطر ریشەکەی قاضـی

عَفتا وەو لەگان شەس دەسی تَمام
خەبرێ نیـە لەنَهارو شـــــام ٦٦٤

لَعنی کردوە بَشیرو نَذیـــــر
لە ڕشوە دەروٚ لە ڕشفَت بگیـر

زاهێد کە ها شون پولْ و مالَەوە
کرایەیش پێت با مَیوە مالَەوە ٦٦٦

زیاتر لە دخلْت ئەگر خرج ئەکەی
پێت نایژن عاقل نەفام وئەبلَەی

لە رَسول اللّـە نقلە ئەی سخن
(کادَالفَقرُ اَنَ یَکونَ کُفراً) ٦٦٨

کارێ ئەزانی کاری تۆ نیە
ئامانە مەیکە قازانجی نیە

تەمەلێ هزار کەسی گدا کرد
هزار شازادەی سوک و روسوا کرد ٦٧٠

هیچ بەکس نادەم ماڵیخوم بۆخوم
مالی مَردومیش وک حەلوا ئەخوم

هَرچی بێت لەلای دوسەوە باشە
ئەر پوس باقلەو سوسی خَشخاشە ٦٧٢

تاقت بێرانە لەگریا بساز
هشتا نازانێ ئەو نرخی پیاز

بو مُتَشَیخ موریدیکی کەر
خَیری بیشترە لە دە کیسە زر ٦٧٤

هرکس خوی صلاح مولکی ئەزانی
راوێژیش باشە ئەگەر بتوانی

هرچی کونه خشت پاره ئاجوره
کەلەی کیقباد یا سلم وتوره ٦٧٦

هرکە وەتەمای دونیای دەنیە
بەتەمای خورما لە دارە بیە

کەران هر شەوە ئەوێنن لەخاو
خنکیاون پاڵان دوزان بەلافاو ٦٧٨

جوان مەنیرە بۆ ژن پەسەنن
پیریش مەنیرە تۆ بۆ کەر سەنن

ئەو شتە کە وا شێر ئەکا ڕیوی
هیچی تر نیە غیر دەس نەڕیوی ٦٨٠

بێ ماڵی وەهای بەسرم هاورد
بڎ تر لەوە زر بە قارونی کرد

ڕمر جێگەی ئەچێ کە چینە بوی
ناچێتە جیگەی کە چی نەبوی ٦٨٢

هَر وابوٚ ڕَسمی ئەی دونیای درشت —
کاتێ پشت بەزین تاوێ زین بەپشت

تو ئەم مسئلە ئەشێ بـــزانی ـ
دائم ئاو ئەچی بە ئاوە دانـی ٦٨٤

کار هەر ئەمەیە وتم بەم جورە
ئیتـر ئاو بیرا دستبشـو رە

سەر ومالٚ لە تۆ دریغی نیـــە
بزنم لەدەتمـەن هیچ کمی نیـە ٦٨٦
سفرەی پور بایس ئاشتی مالٚـــە
مالی ناتەواو قرەو جەنجـالـــە
ئەی برای عزیز بوچ ئەونە مەسی
ئەسبت نەسندوە ئاخورئەوەســـی ٦٨٨
دایم والە شون کارێ پەن و گەن
هر بە بێ ژنی بیشکەکەی ئەسەن
چیم کردو چیم بۆ گشتی چاخانــە
نان ئەو نانەیــە ئیستە لە خوانە ٦٩٠
کاری ئیمـروژت مەیلانە ســـوزی
چازانـی سـوزی چی ئەبی روزی

ئەر کەم فروش و گران فــروشی
تێفکرە تۆ بۆ وارث ئەکوشـــی ٦٩٢

بەسە بۆ دونیا ئەونـــە مەکوشە
بۆ قیامەتیش جَم بکە توشـــــە

پاکی و قناعت بکە وَ پێشـــــە
بۆ رزق و روزی ئاخ هڵ مەکێشە ٦٩٤

هرکس گیرودەیٚ دس حِرس و ئازە
ئەرشایە مەیژە پیٚ بیٚ نیاز ە

ئەگر تەماتە حورٚو ئازاوی ـــ
قرض مەکەو مەیذە هرتاکە ماوی ٦٩٦

ئەگر تەماتە ژینت بیٚ راحـەت
خوت عادت بذە تۆ بە قَناعەت

پوڵ عقل و شعور زو شَیدا ئەکا ـ
بە تایبەت موفلیٚس زورِسوا ئەکا ٦٩٨

زەوین و زمان وەهم بدوز ی
بەکسی نادن زیادە روز ی

تەواو زور خوشە دوشاو فروشی
کسێ نەیسێنـی هر خوت بینوشی ٧٠٠

لەماڵێ قاضی گوێز فراوانـــە
وەلێ ئەیژمێـرن دانە بەدانـە

گدا هرچند کە جل برگی شڕە
ئەگر روی ڕەشە کیسەکەی پڕە ٧٠٢

دەس نادا بو کەس وَبێ دردیسـر
بخواتـەو ئاوی زَمزم وکوثَر

کسی ناو ماڵەدو نەووی نەوی
هَشتیەکی چەس تا مارەئی چەوی ٧٠٤

خودا بیبەخشی بابم، هَمیشــە
ئەیفەرمولە کوی چاکان بنیشـە

خوشە ماڵی زل بەرزو بەر کشاد
روبە قیبلە بێ دڵ مەکەروشاد ٧٠٦

لازمە سردان دوس و قوم و خویـش
وَلێ بەو مەرجە لە حد نەوی بێش

حاشا لەکەسێ وێڵ وبێ کاروێ
بۆ پیاوی بیکار ئیـوارە ناوی ٧٠٨

کەسادی خاصە لەسەربەسـەری
کەرێ بەکەری سنانـی دەزی

کەم بخوەو بۆ خوت قانع دانیشە
منت قصاب و بەقاڵ مە کیشـە ٧١٠

کار وەکو شیرە تابوی نە ریوی
دەستی بۆ بوەی ئەویتـە ڕیوی

هەرکەسێ بوخوی باش ئەکا تەلاش
دوم بیێت و جا بۆ خوی بکا کڵاش ٧١٢

کارەکان هەموی کارِ ئالتونـە
بەناو بانگیە کەی بەناو خاتونە

چون ئەبی دوکار وەجاری بکەی؟
کاری بۆکاری ئەبێ پک بخەی ٧١٤

جەم دانی کەما بو غیر کەرنیـە
کەر کە بتوپی کەما بو چیـە

لە هولەی خوما بنە ئی ناکا
لە هولەی مردم سەرپەڕی ئەکا ٧١٦

هرگز مەکێشە منتئەم و ئەو
خوتتەقالا بە بەروژو بە شەو

شرطە تو ئیستە بچیتە بەرەو
گلێمتلەئاو بێریتە دەرەو ٧١٨

ئەر هەر دانیشی و تەقالا نەدی
مەگەر گنجەکەی قارون پیداکەی

تەقالا بدەو قولی لێ هەلمالێ —
هیچ وەختوەخیالێ کەس نەیوە بەمالێ ٧٢٠

بەروژ بگەڕی بێ کارو بطالێ
بەدستی خالی ئەڕویتەو بومالێ

کاری خوی داوە بە نیمە کاری
خوی هاتوە شار بو کرێکاری ٧٢٢

دیر قرضەو دانن لە نەداریە
دستنگی مایەی شرمەساریە

کەپەنک لە پاش باران و بەفراو ٧٢٤
نوشدا رولە پاش مردنی زوراو

لە خوتا ئەگر تو نەکەی فرمان
ئیتر خەڵک ناکا گەرمیانکیوسان

وەکاسەی هاوسێ بیر بکەیتەوە ٧٢٦
ئەبێ وَبێ شیو سەر بنیتەوە

سورناچی برسی زوری بوبیری
زەماون خەڵکی ئەکەفیە بیری

گدا بکەی سەری بەشائی ٧٢٨
ناچی لە بیری مەزەی گدائی

کوشە لەی دونیا گوشەیکت بوی
بو قیامەتیش توشیکت بوی

هرکەس تەمایە طاوس بوینی ٧٣٠
جوری هندوسان ئەبێ بوینی

هرچێ خوت نەیکەی بێ سودەکاکە
بەدستی خڵکی ماربگری چاکە

لەصد ئاسیاو زمهەر ئەکابان ٧٣٢
نای مالێتەوە ئەو لەیکێکیان

چون خوی ناگوڕێ کاری خودایە
لەو هایەومایە هاتوە ئەوپایە

مالێ دونیائی وەسە چڵکی دس ٧٣٤
بەینێکا نیە لەبێنێکا هەس

مالێ پورلەرا زیانەس هەمیشە
خویان ئەمرن بە دردی دل ئیشە

تاقە مریشکی دایم هیلکەکەر ٧٣٦
باشترە لە دو گاوی جفتنەکەر

ئەگەر روسەمی نەتەوەی زالێ
هیچ قوربتنیە ئەگر بێ مالێ

کاتێ نەباری فەلائی ئەکا ٧٣٨
وختی بواری ئاشی کار ئەکا

لەبانجە بۆکەس رزق نایێتەخوار
ژین کەی ئەچەرخی بێ کوشین وکار

ئەگەر کاربکەی باش وشیرینی ٧٤٠
ئەر نویژ بکەی پاک ونوربنی

شوان هەرتاکە فرە بخەوی
ڕانەکەی زور تر دورەو ئەکەوی

یەکی ئاغەیە و یکی کوێخایە ٧٤٢
یکی فعلەیە یکی بەنایە

هر کاری سختە ئەیژم نازانم
نازانم بیوە راحەتی گیانم

بە کەر ناویری بە کوپان شیرە ٧٤٤
جابێ ئەو کەرە لە قوردەر بیرە

تو کە حاضر خور بیخ سێوەری
هیچ خیرت نیە هر دەردی سەری

پیاو تەمەڵ و گوڵ هەم دستەوستان ٧٤٦
چ لە گرمیان چە لە کوهستان

تا گوێرەکەئی بکرێ بە گاو
خوین ئادەمی ئەکریێتە ئاو

بنی هەوانە ئەگەر کونا وی
به جوالَ تی کەی هیشتا پر ناوی ٧٤٨

هەرکەس بەهارو تاوسان نەکوشی
زمسان کوتەکەی ئەبێ بفروشی

حَتمی بیستوتە توکەم یا فره
زیلە لە هەلوای نسیە بهتره ٧٥٠

راضی بە کەم بە قرض مەدەبگشت
نو بدُه بەهشت هشت بگرەلە مشت

کەسێ کە کاری هر گدائیە
ئەگر پای بوی بۆی زیائیە ٧٥٢

وائەیژن گەلی لە مُقتَصدین
سرکەی موفت شیرین ترەلەهَنگوێن

ئەوەل بوژوانە بۆ ئاخری کار
با ئاخری کار نەبی شەرمەسار ٧٥٤

هَر جور بسێنی هَرنرخی دَر هات
باز هرزانترە لەهَدیەوسەوقات

خو دیوته بزن بوتا قـه شەو ی
تا جێ خوش نەکا هرگیز نا خەوی ٧٥٦

بچو تێکوشه غیرەتی بە خـــو ت
نا ن تا نەی جا وی قوت نا دریبوت

دا یم دلـّت بێ وەلای یا رە وە
دستبیشت بوی هەم بــە کا روە ٧٥٨

با شیا ن فرمووەورا سە وهروا ســـە
پول سپی هەر بو روژی ڕەش خا صە

هەمیشە ئەم وت‌گا بورم شیـّرە
خوی کردە وشتر لەترسی گیـّرە ٧٦٠

گەرەکیە توشي دردی سەر نـــە وی
ما سي بگری و قولی تەر نــــە وی

بوکا ری بچوک ئەونە مەکوشــــە
گوم هەرچێ قولّ بێ پا مەلەی خوشە ٧٦٢

هر گز تەمەلّی نەکەفیە بیـــر ت
دەس ما نیا و بنە سەر زکی تیـّرت

پیاو دیتە بیری کەزوری بوهات
قرضداری کونەو خزمی دور وڵات ٧٦٤

هوڵە ناکریی بەبزنی هەژار
گایٚ جوتی ئەبی و پیاوی کونەکار

گەرەکتە زحمەت نەکەفیە مِلت
ماسی بگریت و تەڕ نەبێ قولت ٧٦٦

ئاسیاو ئارد ئەکاو جەوهەرئەنوێنی
چەق چەقە چانەیخویئەشکێنـــــی –

سەختە بوکەسێ بێ ماڵ و پوڵە
کەر طلای بوی گەورەوماقوڵە ٧٦٨

ئەربە دورو وێژ ناوت دەربچی
قیمەتت ئەڕوی ئابروت ئەچـی

ضـرەر لە هر کوی بیگریتە وە
خیرەو قەرەوی زوئەبیتەوە ٧٧٠

کشتیت غَور بووە وادژ داماوی
یاپیرە ژنی دوڵە شـــە کا وی

وتیان بە وشتر کوڕێکت بیوە
وتی لەبارم هیچ کەمەو نەیوە ٧٧٢

ئەم قسە تواو بە سودو کەڵکە
پیاوی خوش حەساو شریکی خەڵکە

کو ئەکاتەوە مورچە لە هاوین
تا لە زستانا نە مێنی خەمین ٧٧٤

کەی بە هو کردن ئاسن نرم ئەوی
لە کوی بە شەمیحەمام گرم ئەوی

چَق بەلەداس و زوربەلە هەسان
منتی لاڕان دومەژن مە زا ن ٧٧٦

راستە کە گدا شێڕی خودا یە
شێریکە وەلێ بێ دست وپا یە

دا تەکانی بە هەڵسەرە سەرپا
غیرەتت کوانی یا خوا سگ بیخوا ٧٧٨

هیچکەس بە ئاسان ناگاتە خوَشی
ئەبێ دەورانێ زحمت بچەشی

***************



## (بەشی میوان، ) ١٠٠

ئاغەو گەورەئێ خرجی گرانە
ریشت هێشتوە هەڵبگرە شانـد ٧٨٠

قدری سیم و زر زرگر ئەزانـی
قدری گوڵ بولبول باشترآزانی

پیاوی میوان دوس بۆروێتە هرکوی
بێ منت جێیگەو توشەی خوی ها، پێ ٧٨٢

میوان بەخیر بێت رزقی خوی پیە
میوان خوی جژنێ بۆ خانە خویە

میوان هیچ خوشی نائێ لە میوان
خانە خوی تورس هەم لەهردویان ٧٨٤

میوانی دێر وخت ناوێ گلە کا
بیخواو شوکر کا ،هرچێکیا ئێیدا

هیچ وختی مەدەکاربە میوانا —
مەر بە کێف و میل خوی بێتە هانا ٧٨٦

نازوی نا ئومێدکەسلەمالیا
یاخوا دەس نەکا کیسەی خالیا

با جێ مێنی لە کاروان و خێلێ ٧٨٨
ناوی مێوانت تو بەجێ بێلێ

مێوان ناروانی خوبوطعامت
بیری وا بە لای خولق وکلامت

بوچو شوکر کە چون مێوانە کەت ٧٩٠
رزقی خوی ئەخوا لەنیو خوانەکت

بیرا بۆ مێوان هرچی حاضرە
چونکە ئیسرافە مخارج فرە

ئەر خرج و کڕین لەپای مێوانە ٧٩٢
بە حاتم طائی بوون ئاسانە

سونەتە مێوان بکەی ڕەوانە
هرتا ئەڕویتە بردرگای یانە

کسێ نان بڎەو همت بولنڎە ٧٩٤
مالێژی کەم بێ هر دەولەمنڎە

میوان عزیزە بەلای خوداوە
پیش خوی حوالەی رزقی کریاوە

*********************



# ١٠٣
## (بەشی دوسی ،رفاقت وەفا وبخشین)

بەم شێوە هەر، نە، تیژی لە کارم
وا دیارە تویش نەویبە یار م

گورگی برسی کەی ئەپرسێ ئەحوالّ
وشتر مالّحە، یا کەری دەجـال ٧٩٦

ئەو کەسە دوسی سەروما لّیـە
وا شریک خم و خوشی وتالّیـە

بلّی هر وایە گشت ئاکامی جنـگ
یکی پیروزەویک لە قبری تنـگ ٧٩٨

لەلای ئاسنگەر کەسێ دانیشـی
جلی ئەسوتی و سەریشی ئەیشی

دوژمن دوژمنت بەدوس بزانە
دوسی دوژمنت بۆتێهەلّدانـە ٨٠٠

کەسی بۆخوی بێ ئەوە کەێ ژیرە
ئەوکەسە ژیرە خەلّکی لەبیرە

برا ئەر خوشت دی لەحەساوی
برا ئیمان برا کیسە جیائی ٨٠٢

هَر وَخت دست بوٚ بەکەوگیرەوە
چاوێکت بوٚی بە فەقیرەوە

خوا بیپێچێتەو دورو زەمانە
تاکە قرانیش بیوە جژنانە ٨٠٤

پشتت ئەر ناخوین خوت نەیخورینی
ناخوێنی مَردم خرُوی نامرێنی

کاتێ باوڕو ئیێعتمادنەما
نامێنی بودوس غیر لە مَرحەبا ٨٠٦

هَر خاص وراس بە/ پکت نەکەوی
کس لەرێکەی راس پای هَلّناکەوی

ئەگر فرصت بو هیچ مەکە ونوز
ئَیژی لە قرنی شەمەبەنَوروز ٨٠٨

چون ئەبێ خاصی شونی نەمێنی
مزگەوت ئەربڕمی مێحرابی ئەمێنی

کسی بیٚ سَند قرض باته دوسـی
یا پولیٚ لەدەس ئەدا یا دوسـی ٨١٠

قسەیٚ زورم بوٚ بێژمی بود و س
وەلیٚ دوس پیدا بوٚم نەبوٚ آفسوس

مَیژە فلانی خاون ئەقنرەباس
هزار کسی بوٚینا کس هرتَنیاس ٨١٢

دوسێ باوەفا بەهَرقیمتـیٚ
ئەربی فروشی توبیٚ غیرە تـی

بە دوسی مەگـرە رفیق گیانـی
تا چند جار نەیکەی توٚ ئیمتحانی ٨١٤

ئەگر تەماتە دوس بکەی پیدا
دوس هەلٚ ژمێرە لە خێلیٚ گـدا
ئەر لەگر منـی تولەیَمنی
ئەرلە یەمەنی تولەگر منی ٨١٦

بوٚروٚ ئەی خواجە هَرچِت هَس بیدە
یاری بسینەو لەدَستی مەده

کاتێ ئەتوانی ئینسانی خاص بێ
لەگر خالق وَمخلوقا راس بێ - ٨١٨

سگ وتیە ڕێوی کەی جژنتانە
بێم بۆ دیدەنی و بێنم جژنانە

وتی ئەو روژەی کەتو ناوێنم
جژنی گەورەمە لە ماوەی ژینم ٨٢٠

مەپرسە بۆ کەس ئائێن ودینی
پرسە لە هاوڕێ ولە هاونشینی

بوکاکە دەرویش دۆکە قات نیە
ئەرتو دوسم بی دوژمن بوچیە ٨٢٢

دارێ تاقە دار قَط نابێ بە دار
دوسی دور وڵات قط نابێ بەیار

کارێکە دوسی قدیم بمێنی
ئاو ئەروا وەلێ ریخ هرئەمێنی ٨٢٤

دوس ئەوکەسەیە بڈکا گرینەو
دوژمن ئەوەیە ئەڈکا کەنینەو

دوژمنی دانا برزدئەکاتەوە ـــ
دوست نادان بێ پوچت ئەکادەوە ٨٢٦

ئەگەر نەناسی دوژمن و دوست
هەربە زیندوی ئەکەنن پوست

تاکە نەزانی دوستیک ڕووە
سفرەی دلێ خوت بوی مەکەرەوە ٨٢٨

بەکاکە کاکە، هاتە لامـــــــە وە
ئاخر وەک سوجە، دایە پامـــەو ە

ئەوکەسە کەوا حیسابی پاکە
لە حیسابکەشی بێ ترس وباکە ٨٣٠

وێڵ کە بێگانە عومری نەمێنێ
دوس گوشتت بخوا اِسقان ناشکێنێ

ئەگر هەر برا لە پشت براوێ
ئیتر مەر قـضا لەلای خوداوێ ٨٣٢

ڕیوی ئەگر شیر ببێ لە پشتی
وردئەکا کەلەی پڵنگ بەمشتی

ژن کەفیێتە شون رسوا ئی، زشتـــی
سێ بەردەی طەلاق زوبنە مشتی

ژن بیژێتە پیا و بەتو چە مربوط
ئەوە ئەشغالە بیخە نێوی پو ت
٨٣٤

ژن ئەگر بالە در بێ حەیائی
هیچ چا رەی نیەو علاجی نا ئی

بعضی ژن ژنە با زێکی ژا نە
با زی هرلەبیر لێبا س ونا نە
٨٣٦

شو مردورنوجا ر، زا یو بخوا زە
طەلاق دەرا وا ن سەرخو مَخوا زە

ئەگر ژنە کەتلێت هەلْ ئەما لێ
ما لّ وەجێ بێلە ڕوبکە یـــا لــی
٨٣٨

خا نو یەکێکەو کدبا نو دویـــــە
بۆیە خاک وخولّ هَتا ئوژنویـە

ژن بەڵاس بۆی لە هەر خانووێ
یا ڕەبهیچ ماڵێ بێ بەڵا نەوێ ٨٤٠

ژن کە دو دڵ و دە زوانی هەس
رازیدەرونت پێ بێژی غوسەس

خیزانی صالح ئەر دس ڕنگینە
سۆتونی ماڵ و کولەکەی دینە ٨٤٢

خوا ئەردای ژن و کوڕی حسا وی
شوکری ئەو بکە هەرتاکە ماوی

کاتێ کە ئینسان ژنێ ئەخوازی
یا ئەیواتە وە یاخو ئەیبازی ٨٤٤

ساکار مەیکرە اِزدواجی ژن
باشترین دوسەو بدترین دوژمن

ئەوێ ژین بکاد ئینسان وەبێ ژن
وەلێ ئەو ژینە ژینی پێ نایژن ٨٤٦

زینەتی ژنان حیاو عیفەتە
ژنێ بێ حەیا طوقی نەعلەتە

سەرمایەی ژنە ماقولێ و حەیـا
حەیا تکێکە کە تکیا تکیـــا ٨٤٨

مرد میدان بی و نترس لە دوژمن
بوت بانا درێ هرگز بەنی ژن ـ

ژن بە پیاو بیژیتوهیچمەکرە
شو٬نیە بێژە گزگە کو تـە رە ٨٥٠

ژن بە بێ کەسی وێڵ وهار ئەوی ـ
پیاو لەبێ کەسی زور هژار ئەوی

ژن وەسە هەنی خاص و خراوی ـ
هێچکە نا ینا سێ دورس حەساوی ٨٥٢

دایک لە بختی ئەگەر راضیـــە
ئەوبختە بۆ کچ ناو جیا زیـــە
بێ بەقا زورن لە نیوانی خلک
وەلێ نەوکو ئەسپ وژن و چـەک ٨٥٤

صفای ماڵ والە گزگ و ئاوە وە
صفای کچ والە بوروو چاوە و ە

زور موصیبەتە دوٚ شت لە دونیا
جوانیٚ تەمەڵ ژنی بیٚ حەیا ٨٥٦

ژن هرکام بی بیٚ عقلی حیسابی
لای شوٚ پیٚ خوشە تاکە لای بابی

کاتیٚ وتتە ژن مانگ و مەلەکە
ئەکەفیٚتە ناو بەڵاو مەهلەکە ٨٥٨

کچیٚ کە گەئی بە هژدەو حەفدە
ئەر موشتەری هات مەویٚسە بیدە

پیاو سەر چاوەو ئەصل و سەریانە
ژن کوکەرەوەو بندو بەریانە ٨٦٠

ئەبیٚ بترسی پیاوی هوشیار
لە ژن شدە لار سالیٚ دوبەهار

ئەبیٚ لە دوٚشت زور بترسی کوڕ
لەسکی هارو لە ژنی دەم شڕ ٨٦٢

کچ تا ئەتوانی ئەبی کەمەن بیٚ
بترسی نەوا توشی کەمەن بیٚ

*******************

111 (بەشی غیرەت و دَسەڵات )

کوڕی خاص چاوی لە میراث نیە
کوڕ ئەگر کوڕ بێ ماڵی بو چیە 864

مەڕوانە قەدو باڵاو شەوکەتی
بڕروا قیمت و هَەل و غیرەتی

مەڕوانە ئاڵەتکە وردو ڕێزە
بیچەشە، بزا چند تۆن و تێژە 866

کاتێ ئەزانی عاقبت ئەمریـــن
مردانە بمرە نە حیزانە ژیـــن

کوڕ غیرەتی بێ فرقی چەس بوئەو
کوڕ ئەگر کوڕە چروژبێ چەشە و 868

هیوام پێیت نیــە زل و بێ خَیری
بە کەر ناوێری بە کوپان شێری

کوڕ ئازا تەنیا جارێکەو ئەمرێ
وەلێ ترسنوک هزار جار ئەمـــرێ 870

روژی کەڵە شیر بۆیت و بمری ـ
خاصتــرە لەژین ساڵی بە مــری

++++++++++++++++++





## (بەشی ظلم وزور وحرس وطماع )

خوشی بۆ مردن دوژمن چە فایە
دونیا بو ئیمەیش هربێ بەقایە

ولاخی شەل و گاپیری شاخدار ٨٧٢
موحترەمترە لە مەردم ئازار

ئەر ترحم کەی بە گورگی غدار
ظولمت کردوە لەپەزی هەژار

کەس خوشینایی کارینا حەساو ٨٧٤
نە سیخ بسوزیئەبێ نەکەواو

پشیلە کەدی، دوگ بویمەحالە
وتی خوم حزی پێ ناکم تالە

ظالم بێ بە پرد مەروبە سریا
با بە دەمی سگ پیس ناوی دەریا ٨٧٦

چرای مظلومان دایم کەم نورە
ئاوی ظالمان سەربەرەو ژورە

ئیتر لەو شوێنە کارت نەماوە
ئەومانگا مردو گوێرەبڕیاوە ٨٧٨

بَبینیکە خەڵک لێت ئەسڵەمێتەوە
کاسە پڕ ببی قڵم ئەوێتەوە

بێخو ئەوەندە بەخوت ئەنازی ٨٨٠
نەسەر سیری ونەبیخ پیاز ی

پیاو مالێ ئەوی ژنان طەڵاوبرگ
قصاو خەمی پی ، وبزن خەمی مەرگ

گەرەکتە دوربی لە گێرەو کێشە
بقد بەڕی خوت پارا بکیشە ٨٨٢

ئەی خوین مژی گەل نزیکە بمری
ئَیژن سگی هار چل روژە عومری

هرچی میرولە کردی بەسالێ
وشتر لێسی دا هربە قپالێ ٨٨٤

پشیلە لە حال کوێری و کەڕی
باز هم لە شونی مشکا ئەگەری

قفس ئەگر چە دوڕی ثمینە
پەلەوەر ئەسیر تیا خەمینە ٨٨٦

کەر ئەگر بیبی دوشاخ وەکو گا
تەواوی زوین ژێرو ژو ئەکا

ئەزانم لای تو ئەم قسە تاڵە
زوربێت قەباڵەئیتر بەطاڵە ٨٨٨

کاتێ بە خوشکە هیچ ناگرێتەگوی
کوتک ئەزانی قوناخ هالە کوی

خوا قادرە، تولە ئەسێنی
بو هر ظاڵمی زوالٚ ئەکەینی ٨٩٠

نانێکی خواردوە ئەو بەو ڒونەوە
ئیستەیش هر ئەڒوا سەر ئەو شونەوە

ئەگر شیرنادەی لەقە مەهێنە
ئەر خێرت نیە شەڒیش مەکەینە ٨٩٢

کاتێ پولٚ قسە ئەکا بوکەسێ
حەق وعدالەت زوان ئەوەسێ

ئەگر سەرچوپی بڎەی بە گامێش
ئەویش هربولای کاڎن ئەیکا کێش ۸۹۴

ئەر دورو ویژەو،ظالم و،شیطان
بڕوی بەری با و،پشتیکنەلان

هَر بۆ کوێرائی چاوی دوژمنم
ئەبی بیسازم ئەشی بیسەنم ۸۹۶

یاخوا دوژمنت هم کەڕ هم لالبێ
نشمیل سبەبکار وەکویزوخالبێ

پێویستم نیە خنجرو چەقو —
واللّهی سەری دەبرم بە نەوو ۸۹۸

شا،نەو شیروان وەزیر بَختیار
کەلاوات ئەدەم هزاران هزار

دی نەما موفتە بێرا پارەکَت
خوا عَفوی کا، مرد با بێ،پارەکت ۹۰۰

ئاگر ئەکەمەو لەبان پشتت
تا توبە بکەی لە کار زشتت

شته کانی خوی جیاو تەرێکە
وەلێ لەماڵی خەڵکا شەریکە ٩٠٢

ئەربیشی وێنێ لەنیوی قەبرا
یک دو پالەقەی ئەدابە سەرا

گدا هەرچێ زور مل لارەو بکا
بزانە زورتر ئەو دورو ئەکا ٩٠٤

کەم بخوە، با مفت با بێمنەتە
ئەرکای خوت نیە کادان هی خوتە

سودیش هاتوە سەرمایە ئەخوا
حسود لەدورەو هاکەدیق ئەکا ٩٠٦

بۆ ئەو قیدێ نیە جوربی یا ناجور
پوڵ کەفن دەربێ مردو گوڕبەگوڕ

طمع چێناورد بەسەر ئینسانا
کوسە چوبۆ ریش سمێلێشیدانا ٩٠٨

ئەونە حریص و پوزمودەعایە
بە قولێ مشهور کێچی بەگایە

هەڵامات مەدە کەمدس دا کیشە
بقدْ بەڕی خوت پارا بکیشە ٩١٠

کاتێ کەرشفت بێذ لەدرگاوە
عداڵت ئەروی زولە کونا وە

بزن ئەر نکبەت ڕوی لێ بکا
طمع لەتوشەو نانی شوان ئەکا ٩١٢

تو کە پایکتوا بەلێوی قبرا
تاکەی ئەکوشی بوماڵیدونیا

کوانێ شدادو،نمرودو فرعون
تازە تەماتە تو هەڵبەسی تەون ٩١٤

ئەونە بە دونیا تومەبە دڵ خوش
طاق کیسرا بوبە لانەی بایە قوش

گر بدری بە کەرە دوشاخی گامێش
هیچکەنا تواتێ لێ بچیتە پێش ٩١٦

صاحیو ماڵ دس لەماڵی هەڵ اگری
دز هر بەهانەی حق زحمت ئەگری

سەگی شوان ئەیژی یەکەیٚ ژیانە
خوزگم بەو سەگە ها، قەماوخانە ٩١٨

بێ تاوان سەری ها بە دارەوە
تاواندار خوشیە بەلاییارەوە

چە باش وتویە دانای هونەرۆر
سگ زەماوەنیە بەتوپینی کەر ٩٢٠

بۆ کولیژەی ساق هەتیوئەگریا
ئەوەکیشی بۆ سگ کردی پیا

بێلا لە جێ کەم فرە بنێری
مشهورە ژڕدی رسوائی تێری ٩٢٢

چون هاوار نەکەم من لەم حقکوشی
مردم برق ئەیگری من چرا موشی

ئەم پندە چاکە زور موعتبرە ـ
ماڵ خونەخورم دوس میراتبەرە ٩٢٤

کسی کە رژدو مشتی قوچاوە
شێر بە کوی بگرێ هشتا بذناوە

ئەولْ بیّرانە درزیک بەلەخوت
جا جوالْ دوزی بەلەبراکەت ٩٢٦

هر وایە رَسمی دَوروزمانە
پادار بگرە، بێ پاهی وێمانە

تاوێ کلاوەکەی خوت بکە قاضی
وَلاخ توپیوو خاون ناراضی ٩٢٨

ئەلێن کەسەگی ئاشی ئەلستەو
سگێکی تر پاش ئەویەلستەو

ئەگەر هَروابی، خولە، مونافق
خوزگ بەکفن دزەکەی سابێق ٩٣٠

کوڵکی لەخرسێ بکەنیتەوە
هرباشە حەقی ئەسێنیتەوە

هرکەس وتەمای ئیضافە بەشە
حەقیە پێ بێژی کام چاوت ڕەشە ٩٣٢

کەس ناوت ناوا ئیتر وەباشی
چونکە هەربولای خوتی ئەتاشی

کەسێ گوێرەکەی مردم بیریتـە و
گوێر هوسارەکەی بوی ئەمێنێتەو ٩٣٤

دوشتێ ئەمێنی بەپیری مروف ـــ
طماعی فرەو، حرس و ئارەزو

حَسود حەز ئەکا عومرت نەمێنی
ناخوێنت نەبێ خوت پێ بخورنی ٩٣٦

خەڵکی لە دونیا گشتیان ئەکوشن
زوردارو بێ عار، ئەیخونئێنوشن

تا دەوڵە مەنی چوار دَورت پڕە
باوک بێ براو، ئاموزای فـرە ٩٣٨

من ئەڵیم ناوێ ئەیژی تێکوشە
من ئەیژم نێرە ئەیژێ بیدوشە

دوێنی مِلهوڕو ظاڵم بوێت کەچِی
ئیرو سەرشورو کزو مل کەچـــی ٩٤٠

بیستومە ئەڵین مارتا مار نَخوا
هرگیزا ناوی ئەو بە ئەژدیها

نه وەكـرٌەنە ؛ بە، نەوەكوتێشە
كردەوەی مَشار بكە وەپێشـــە ٩٤٢

ئەر مَردی دەمی شیرین كە كەمێ
بەمشت بوەشنی لەنیوی‌دەمـــی

حەیفە لەی دونیا خوت بكەی وەپەن
بوسێ چوار گەزە متقال بوٚ كەفەن ٩٤٤

هیچ وخت بوظالم سرٚمەخەفێنـــە
بودین و وَطن خوێن برژێنـــە

دَس طمع ئەونە ئاوێزان مەكـــە
خاونی كەرەم پەشیمان مەكـــە ٩٤٦

هرداری كرم‌لەناوی دا و یٚ
ئەشكی و ئەكەفی‌بەسوكە بایێ

هر روژ بەگەزی هەرشەوبسەنگی
هر سات‌لەباری هركات‌بەرنگی ٩٤٨

كاتێ بالا دەس‌سركاتە نەبەرد ـــ
سری ژیردەسان ئەرٚویتە ژێر بەرد
++++++++++++++++++++



## (بەشی قَـــن وفیـّل و دورو )

٩٥٠

َحکیم تیّ مردم خوش ئەکا تـــەوە
فتنـــە هر ئاگر گەش ئەکا تەوە

هەرکە عَیبی خڵک بولای تو تیّری -
عَیبەکانی تویش بوخەڵک ئەژمیّری ٩٥٢

کەفتـونە ِگزو فزو فیّل لیمـان
ئاهوی نە گیریاو ئەوخشن پیان

زمسان زَهری خوی نابیّ نەچەشنیّ
روژیکی ماوی دەس خوی ئەوەشنیّ ٩٥۴

هم ئاو هم ئاگر ئەمانیان نیە
هرچند نَفعیان لەبوّ خڵکیــــــە

هاکا بوّن بە گورگ مردم لە دونیـــــا
هرکە گورگ نەبیّ گورگ ئەبیّ بیخـــوا ٩٥٦

بە ئیمرو سوزی َطفرەو دوروٌدان
قَولیّ هاوینت پیّم خستە زستان

دورو، ویژ شتی لەبیر نامێنی
حافیظەی کەمە زو دائەمێنی ٩٥٨

جێگەی شاباز ان کورکورە بازان
ڕیوی لە جێگەی شێران مەتازان

بۆی فن وفێڵە، بڕوای من واسە
نیم کاسەی هەیەلەژێری کاسە ٩٦٠

دوڕوو، دورو وێژ ئەمەیە کاری–
هم لە ناڵ ئەدا هەم لەبزماری

وَک گوڵە بەروژەت بەسر هاتوە
چونهرتا وی ڕووت وا بەلایکەوە ٩٦٢

خواءخوی راستەو خوشی تێ لەراس
راستە دورو وێژ دوژمنی خوداس

فَن و فێڵ ئەکا فەن شَیطانی
تاریف خوی ئەکا پێمیان نزانی ٩٦٤

وەها فیر بیوە بۆ دورو زانین
مَر لەپشت درگا، بێژی خومانین

دز ئەگر لەسەر دزی جەسورە
خوتاریکە شەو تا بێژی زورە ٩٦٦

من لە ئەم کارە سەرم ئەماسێ
سم سمی کەرەو چنگ چنگ هَیاسێ

وتیان بە ریوی شاهیدتِ کیە
وتی کلکی خوم باوڕم پِیە ٩٦٨

قیامت بێدو بَهشت بەش کرێ
بقد کردەوە، سَهم ئەدرێ

کەو ئەو کەوەیە کە خوی بنوێنێ
لەبەرانبەری کەوا بخوێنێ ٩٧٠

پوشتیبانی هەس وا خوی ئەنوێنێ
سگ بە هێزی دُم ئەسقان ئەشکێنی

تا خاون ماڵ هات دز بگری بەدست
دز خاون ماڵی گرت و دەسی بەست ٩٧٢

هەقیە بە فێڵەو فَنیا بنازی
حَتا بۆ شَیطان پاپوش ئەسازێ

ئەو کەسە بەلای خەڵکەو عَزیز ە
سَخی و خوش ئێخلاق پاک و تەمیزە ۹۷۴

بۆ خوت مەکێشە صبح تا ئێـوارە
شەنە کەت بە من باکەی تو لارە

ژن دانیشی لە بەردرگا و کوچــە
نَـهاری هیچ و شامەکەی پوچــە ۹۷۶

کاتێ ئەزانی پستە بێ مَغــزە
دەم بکاتەوەو بکەفیە بِـــزە

وەکو کوچک رەش مـل مەبیزانە دەر
مَتـین بە دایم هروەگ ئابیــد ر ۹۷۸

بوٚ چیمە ئەڵوند سَرد ویەخاوە
دەماوەنم ئەوی سینە سوتاوە

کر ئەگەر باری تیرو تــفەنگــە
گورگی توشی بێ دی کاری لەنگە ۹۸۰

فِقیر شتی هەس کم و کەسریـــە
خَسیس و بخیــل هیچیکیان نیـــە

کا ش گشت حَرا می مەسی با وردا
ئەوسا جا سەیری خەڵکت بکردا ٩٨٢

هرکە خَیا نت کا د لە ئەمانت
ئەوە بێ دینە مەیکە ضَمانت

شەڕ نا با رە بەو ریش و سمیڵە
ئەگر توشت بۆ جێ ئا شتی بێڵە ٩٨٤

هر گز نا گرێ شەم جێگەی چرا
برا مەتورنە بۆ دەسە برا

صد کەنیشک نا ون بەسەرە ژنێ
صد سوزن نا ون بە گا وە سنێ ٩٨٦

ئەر دسی بوڕوی ظا ڵمی غدا ر
نا یڵی ئا و بچی بە گەڵوی هَژا ر

ئەر دوژمن هردو گەوج و دڵپڕن
ئەر زنجیریشیا ن بکەی ئەیبڕن ٩٨٨

ئەگر تەما تە سەرنەخیتە خوار
هرگز بێ بەڵگە مەدە لە بوار

بۆشت لە هیچکە مەلاڵەو کاکە ٩٩٠
سەر بەبێ روزی لەژێری خاکە

قسەی هیچ وپوچ پوژمەلامەتە
ئەر زوان بێلێ سەر سڵامەتە

نان نانی خوم و کوزەلەی کانی ٩٩٢
ماشاللە مێوانی هەی مێوانی

دور بگرە دایم لە گاڵتەو گەمە
چەفنگ ئاخری شەڕوماتەمە

ئینسانی سر راس شریکی خەڵکە ٩٩٤
دورو وێژ جاری قسەی بەکەڵکە

زور کەس گرفتار دەس تاقە ژنە
مێردی دو ژنە جرگی کونکونە

هردایکی کەوا کوڕی دزی ئەکا ٩٩٦
جاری سین ئەکتی جاری سین ئەخوا

ئەم دەورە، برا نفسی نفسیە
تێر ئەصلاً ئاگای لەبرسی نیە

کسێ کە بەقولێ خوی َوفا نەکـا ٩٩٨
ئەو مونا فیقـە مەیکە بە برا

ئیحـتیا ت بکە لە گشت کا رو بـا ر
بی بەلگەو بی پرس مدّە لە بُـوا ر

ئەر را زی مجلیس بوەیتە دەرە و ١٠٠٠
خا ئینی بوخوت فکریَ بکەرە و

لەم دوشتە پَند بگری بەکەڵـکی
لە مرگ و هەلە عێبرەتێ خـەڵکی

ستمکا ر ئەگر زو بەری نەگـری
ستم لیت ئەکا هرتا کە ئەمـری ١٠٠٢

ستمکا ر ئەگر رحمی پی بکەی
تویش ستمکا ری کومەکی ئەکەی

ئەر بو ظولمی کم وتت بە تەوەس ١٠٠٤
ظا لم هر گەشە ئەکا پەسا پە س

دوکس لە مردن زورە ترسیا ن
یکی گونا کا ر یکـی بی ئیما ن

باشترین ئینسان ئەوە لە جیهان ١٠٠٦
کە خَیری زور بێ بۆنەوعی ئینسان
تا دڵخوازی خوت نخوازی بۆ خەڵک
هَرچێ مؤمن بی بازنایی بە کە ُلک
لەئیمانی خوت ئەبێ بترسی
١٠٠٨
کەتۆ تێر بیت و هاوساکەت برسی
طمع کار دایم دڵ پَریشانە
قَناعت مایەی شَوکت و شانە
خوت بپارێزە لە طمعکاری ١٠١٠
دەولەمنیش بی دایم هەژاری
کسێ رَحمی نەو ئەر لەگر خەڵکا
تەماگر نەوی خوا رَحمی پێ کا
روکەلە کسی کە وا خوش رو وە
١٠١٢
بێ خَیرە هرکە دژو بدْ خووە
دیدْنی باشە لە حَدی خویا
ئەگر نەوی بە شانازی و ریا

ئومـــیدو هێوات بوی بە خالـــق
دا مـــەنیشە، وە تـــەمای خلایـــــق ١٠١٤

ناڵەی ئاو لە نارێکـی زوینـــــە
لە ظولمی ظـالم مظـلۆم خـــەمینە

هرچند کە بێـــژی و بکوشی و ڕاکەی
تاکە نان نەدەی ناو پیـــدا ناکەی ١٠١٦

ئەوە بزانە کە نیشی قەڵـــــــەم
تیژ ترە لە دەم شمشیری دو دەم

هرچی لە دس دز بمینی لەما ڵ
ئەشی ئەویشـە بدەن بە ڕماڵ ١٠١٨

هرکسی لەگر رســوا دانیشــــی
ئەبێ رسوا بێ و خجلت بکێشــی

هرکە لە عێبرت خەڵک عێبرت نەگرێ
مردم لە عێبرەت ئەو عێبرەت ئەگرێ ١٠٢٠

هرکە نەچەشێ چێو ئاموز گـــار
ئەبێ بکێشی جـەفای روز گـــار

دوژمن ئەویە دوس لە بندی خانە
هرچند شرّ ئە کا، وەبێ بهانە ١٠٢٢

هێواو ئارە زو عَیب نیە بۆ لاو
بیستن بۆ گویە تواشا بۆ چاو

هرکەسێ کە وابێ مالّ و زەڕە-
هر وەکو مەلێ بێ بالّ و پڕە ١٠٢٤

نەزان و تەملّ هر پَریشانە
تا ماوە بَشی هر ئاخ کێشانە

ئەگر نەبوایا زکی مالّ خراو
هیچ پەلەوەری نەئەکفتە داو ١٠٢٦

هرکاتێ زانیت یارەکت ئە هلە
بزانە ئیتر کارەکەت سەهلە

لە گر هر کسی کردت خراوی
بترسە لە ئەو هرتاکە ماوی ١٠٢٨

مەوە بە رفیق یار بێ وَفا
بۆکەسێ بمرە یاوت بو بکا

هرسینەی ذکری خوای تیا نەوی ١٠٣٠
وک مَحکەمەیکە قاضی تیا نەوی

ئەگر ئینسان بێتخوی فدا بکا
لە وە باشترە خەڵک فَنا بکا

تاکە نە زائی بیگانەیە ژن
کاتێ بزائی ئەویتە دوژمن ١٠٣٢

تواضع بو مل بەرزان ظَریفە
تواضع هەژار ئەرکەو وَظیفە

مەچو بە جێگەی کەدَرت بکەن
وَجێگەی بچو کە خوڵکت بکەن ١٠٣٤

حریص همیشە پوڕ دەردو خەمە
هرچێکی بۆی هر ئەیژی کەمە
درگای دوس گزگ بدُە بە موفتە
درگای دوژمنت هیچوخت مە کوتە ١٠٣٦

لە شەڕا هەڵوا بەش ناکەنەوە
عاقلان دعوا گەش ناکەنەوە

زور كەس ئەتوانى خرابە بكا ١٠٣٨
ئەر پياوى (اَحَسِنعَلىٰ مَن اَسا')

لەسەر قبرەكەى بارام نوساوە
كەرَم زور باشە ستەم خراوە
ئەم قسە بەئاو طەلا بنوسە- ١٠٤٠ا
دوس لە تنگانە جيت نەيلىّ دوسە

باشترين جێگە مولّكى جينانە
باشترين قسە قسەى قورئانە
بَقدْ هرچىٚ خوا مەيلى هالە سەر
صَلّوات بى لە روح پاك پەيغەمەر

تەواو بۆ پَندى پيشينيا نبەيارمەتى
يەزدا نبەپێنوس برا تان ئەحمەدى .)
٧ / ٧ /١٣٦٨ هەتاوى

۱۳۴

بسم الله الرحمن الرحيم

*

بەناو کەسێ کە خاون تەواو کائێناتە

بەتەوفیق ذات خاون عِنایت

بەڵکو بدەرو پێمان هێدایت

بەیان بکەرون مـن ئەم حکایت

جە سالاری دیـن کـردن رەوایت

مواچان روژی رەسولی خـوا

چەنی سەلمان شـی یانەی مورتضی

حضرەتی علی چوو بو بازار

زەهـرا ئەوانـی گیر دا بونَهار

هینایـە خزمەت ذات موصطفـا

تا سێکی پـوڕ لـە عەسەل موصَفـا

تا سی روشن و هەنگوێنی زو لاڵ
ڵ
کوتو پــڕ تێ کەفت تا لێ‌مولەوحا
حضرەتی رەسول بە ئەو ڕێز بینی
تواشای فەرمو ئەو مویە بینـــی
حضرەتِ حَسَن و حوسین سەروە ر
بون لە خزمەتی سالار محشـــــر
کریا بە حضرەت لەوکاتە ئێلـها م
قیا س بکەرون هەرکا م لەوطعا م
هەر لەو کاتەدا رەسولی بێدا ر
ئەو کاری بەوا ن فەرمو پیشنـــیا ر
ئەوا ن قەرا ر دا ن سلما ن فا رسی
ئەوەل جا ر بەیا ن کەرو قیـــا سی
سەلما ن وا ت مومن لەلای من وا سە
دڵی زور روناکترە لــەو تا سـە
هەم مەزەی ئیما ن بۆ ئەو بادیــنە
زور شیرینترە لە ئەو هەنگوێنە

زور باریکــره ئیمان هەڵگرتن

لەو تاڵە مووە تا کاتێ مــرد ن

محمّــــد فەر موی بە سلمان اَحْسَن

ئەو جا ئیشارەی فەرمو بە حَسَن

موجتەبا فەرمی یە رأ ی منـــــە

حوکومەت وەک ئەو تاسە روشــنە

فەر مانرەوائیُ لەم سەرزەوێنـە

زور شیرینتــرە لە ئەم هَنگوێنە

وەلی عدالَت وەها کارێکــــــــە

نازکــترە لە و مووە با ریــــکە

جا لە پاش ئەوان حضرەتی حوسین

وایە بەیان کرد بوٚ فَخری کوٚنیَن

وات عیلم لەم تاس زور روشنترە

زانین لە هَنگوین زور شیرینترە

عَمل بە زانین عولومی ڕفـــــرە

لەو تاڵە مووە زور باریکـــترە

ئەوجا محمّد خەتم ئەنبیا
فەرموی بە بطول فاطمەی زەهرا
زەهرا بەم شێوە هەم فرمویَیان
ژنی صالحە هەم خاون ئیمان
نورانی ترە لەو تاسە صافە
باوررم وایە وەبێ خیلافە
هەم شەرمو حەیا لە سیمای ئەوا
شیرینە هەر وەک عَسل موصەفا
هەم خو پاراستن لە نامەحرەمان
زور نازکترە لەومو بێ گومان
لە ئەو کاتە دا حیدەری صَفدەر
گەییشتە خزمەت رەسولی رەهبەر
موصطفا لە پاش سەلام وصەفا
فەرموی بە علی ئەی ئەسد اللّە
حاضرین بۆ ئەم تاس و هەنگوینە
هەر کام تەشبێهی کردن بەم وێنە

حضرەت یەکا یک تشبیها تیا ن
بو حضرەت عەلی فەرما وا بەیا ن
خوشی ها ت علی لەو قەولْ وبەیا ن
تەحسینی فەرمو ئەو لە هەمویا ن
ئەوجا هەم حضرەت فرما یا حیدر
تو هەم بفەر مو یەک ئیظها ر نظر
حیدەر کەررا ر ئا ما بە گوفتا ر
عرض کرد یا رەسول حبیب موختا ر
مێوا نی عەزیز کەم بن یا فر ە
لای من لەم تا سە زور روناکترە
هەم مێوا نداری لەلای خا ون ما لْ
شیرینە هەر وەک هەنگوینی زلا لْ
رەضا یەت میوا ن لازمە فر ە
یا نێ لەو مووە زور نا زکترە
ئەو جا شای مەردا ن وتێ یا نبی
ئیوە هەم فەرمون بۆما ن تشبیهی

حضرەت بەم شێوە فەرموی لەوباسە
مَعریفەت روناکترە لەم تاسە
گوێ دان و فێر بون لە ئەو زەمینە
زور شیرینترە لە ئەم هەنگوینە
گرتن و داچون لەسەر ئەو فیکرە
لەو تالە مووە زور نازکترە
هەر لەوکاتە دا جبرەئیل ئەمین
هاتە خزمەتی ختم اَلْمُرسَلین
عرضی کرد رەسول تشبیهاتتان
هەمویان باش و پوڕ سودو معنان
منیش تشبیهی بە خاطرم هات
ئەر ئیزنم دەری عرضی کەم لەلات
حضرەت هەم فەرموی ئەمین رەحمان
بێژە تا بویان بکەرون بەیان
جِبْریل وات خالق حەی ئەکبەر ە
ذاتی لەم تاسە زور روشنترە

ڕێ حەق لەم هەنگوین زور شیرینترە
ڕەضای حەق لەم مو زور باریکترە
هەر لەو کاتەدا لە خودای موبین
خیطاب هاتە سەر جبرەئیل ئەمین
سەلامم گەینە ڕەسولی ئەقدەس
لەو کارە منیش تەشبیهێکم هەس
باغاتی بهشت ئەومولکە فرە
خەیلی لەو تاسە هەم ڕوشنترە
نیعمات و میوەی ئەوند شیرینە
خەیلی شیرینتر لە ئەو هەنگوێنە
ڕێگەی گەیشتن ئەو باغە فرە
لەو تاڵە مووە زور باریکترە
ئەبێ عبدانم بەنیەتی خاص
تێکوشن بە جخت بەصدق وئیخلاص
تاکە بگەین بە ئەو ماوایە
لەوی دانیشن هەتا هەتایە

کەیف بکەن لە پای حوران و قُصور
بۆخوَن بنوشن شرابًا طَهور
طعام وشەراب وَمَا تَشْتَهى
سەیرانی نیعمەت مَا لا یَنْتَهى
رەحمەت و بخشش لە خودای رەحیم
رزگاری دایم وَ فَوْزٌ عَظیم
صلوات و سەلام بیحەد و شومار
لە روحی ئەحمەد باش ئاموز گار
دورودو رەحمەت بواری نسم نسم
لە روحی ئەحمەد ئاخر معلم
هەم ئەصحابان و ئال و تابعین
خوا راضی بێت لەوان ئەجمعین
تەواو بو بە یارمەتی خوای گەورە بە
پێنوس مەحمود ئەحمەدی دی ولان لە
سەرەتای مانگی مەولود سال (١٤٠٦)کوچی